


2016

مللەت محەمەد

د ماڵبچویکێ هەدا زارۆیەك تابۆتا خوە دروست دکت

DI MALBIÇUYKÊ HE DA
ZAROYEK
TABOTA XWE DIRUST DIKIT

Milet Mihemed

2016

Di Malbiçuykê He da
Zarokek Tabota Xwe Dirust Dikit
Milet Mihemed
2016







# د ماڵبچویکێ هە دا

# زارۆیەك تابۆتا خوە دروست دکت



**مللەت محەمەد**

- ناڤێ پەرتووکێ:  د ماڵبچویکێ هە دا زارۆیەك تابۆتا خوە دروست دکت

- بابەت: هەلبەست

- ناڤێ نڤیسەری: مللەت محەمەد

- پێداچوونا زمانی: دلێر کەمال

- دەرهێنانا هۆنەری: هەرمان ئومبارەك

دیزاینا بەرگی: مەهدی بامەرنی

- تیراژ : ﴿٥٠٠﴾ دانە

- بوها : ﴿٥٠٠٠﴾ دینار

- چاپا ئێکێ ـ چاپخانا ڕێنما ـ سلێمانی/ ٢٠١٦

- ژمارا سپاردنێ ﴿ ٢٠٦٨ ﴾ ل سالا ٢٠١٦ ل پەرتووکخانا بەدرخانیا/ دهوك

## پێشەكی:

دەمیٚ من ڤیایی سەربكەڤم ل پشتا چ بونەوەران سوار نەبووم، ژبەركو من نەڤیا بەندایەتییٚ ب هەلبژێرم و هەر كەسەك من لدویڤ حەزا خوە ڕابكێشت و بەرەڤ جهەكیٚ نەدیار ببت دا كو د ئەزەلیٚ دا هندابىم، لەورا من هزر كر ئاخیٚ بكولم و تۆڤی ل ناخیٚ ویٚ بچینم و ڕۆژانە تێهنا ویٚ بشكێنم، هەتا ئەو تۆڤ ببت دارەك مەزن و ب سەدان چویچك لیٚ ئاكنجی ببن و پێگڤە هێلینان دروست كن، هوسان دیٚ ژیان بەردەوام بت و مالبات دروست بن، ژبەر ئەڤیٚ چەندیٚ من گەلەك خوە ماندی كر هەتا من شیایی تۆڤی دروستبكم، نها لسەر ئەڤان هەموو لاپەران یا بوویە دارستان، دخوازم چ چەق نەهێن شكاندن، لیٚ ئەگەر دناڤ ئەڤیٚ دارستانیٚ دا هەوە دیت دارەك یا هشك دبت، ڕامانا ئەویٚ چەندیٚ ناگەهینت كو دیٚ ژیان بدوماهیك هێت، بەلكو ئەو یا وەرزیٚ خوە دگهورت ل ئەوی دەمی بزانن ئەزییٚ پێكولان دكم ببڕم و پشتی ب دوماهیك بهێم، دیٚ چەكویچەكیٚ و كیسەك بزماران ل تەنشت دانم، ئەڤجار بڕیار د دەستێن مە دا یە، پێسترەكەكیٚ ژیٚ دروست بكن و مرۆڤ خوە پیٚ بگەهینن نهۆمێن دی یان ژی جل و بەرگێن داریٚ ژبەر





بكن و لاپەران ژێ دروست بكن یان تابلۆیەك بەرهەم بهینن و بۆ نیگار كێشەكێ بكن دیاری، ئەگەر ئەم دارێ بهێلن ڕۆژەك دێ هێت و كەسەك دێ بۆ مە تابۆتان ژێ دروست كت و مرنا مە پێ ڕاگەهینت، ژبەركو ئەم نە فریشتەنە ! ئەم جورەكێ بونەوەرانن پێدڤی ب دەمەك گەلەك درێژن هەتا ڕوویێ خوە یێ ڕاستەقینە ببینن، پێدڤییە ئەم گەشتەك كویر بۆ ناخێ خوە ئەنجام بدن و ئەو ئاڤاهییێن مە كاڤل هێلاین نویژەن بكن و ئەو ڕەشاتیا لسەر دیوارێ ئەنیا مە خوەجە بوویی تافێل بكن، دا كو ب هزرا خوە چەندین ڕەنگان دورست بكن و جیهانەك نوی پێ وێنە بكن. ئەگەر نە، دەم دێ ڕكمانی بت و پشتا خوە ددت مە و كارێ مە یێ ڕوژانە، ب تنێ دێ خوارن و ڤەخوارن و نڤستن بت، هوسان نە هەستپێدكن و نە ژی هزر دكن، ل ئەوی دەمی ڤالاتی دێ ژ دایك بت و مرۆڤ دێ ژ مرۆڤبوونا خوە كەڤن !

**مللەت محەمەد**





## پێپکێ کورسیکێ

کورسی لسەر جادەیێ ب ڕێز کرن،

مایکا خوه لبەر سینگێ من دانا،

ل تەنشت من سەرەك کەڤت،

ل پشت من دەنگێ دڕیانا پاتەی هات،

قۆلپکەك لبەر پیێن من کەڤت،

دەستەکێ قەستا بەرویکا من کر،

ئەز کوخیم،

ئەوێ دەلنگ بلندێ بێ ئەزمان،

نامەیەك کره دناڤا مەمکێن سەماکەرا هه دا،

گەرسۆنی، ئەو دگەل پەرداخەك نەفتێ دانا سەر مێزەیا من،





من ڤەکر لسەر هاتبوو نڤێسین: نەکوخە !

ئەوێ ل بەرامبەر من بوویە پەیکەر،

هەتا نوکە ژی بەردەڤکێ گەمژەیانە

گۆتە من: دەربارەی مرۆڤان باخڤە؟

بۆ چەندەکێ من ل دورمانا خوە مێزە کر،

پاشان من گۆتێ: ببورە من شیان نین لسەر تشتێ نەیی باخڤم !





## پارچەیەك ڕۆناهییێ بۆ پەیکەرکرنا دەمی

ل وی جهێ ئەز نەگەهشتیمە خوە،
دێ شاپەڕان هەلدم  و ل گولان گەرم.
یان ژی بلا هزر ببن شاسوار
و ل بەرپەڕێن تە یێن مینا سالێن ژییێ من ڤەشارتی مایین،
هەلبکولن و ئاراستەیی دیاربکن.
بگەهە من،
میلێ دەمژمێری ژ دەستێ من کەڤت!
ئەی پەرتووك،
من ببە جهەکێ هێشتا پییێن مرۆڤان پیس نەکرین !
ئەگەر نەشێی، دەرازینکێن خوە
ل خەونێن من یێن سنێلە ل تاق بهێلی




ملله‌ت محه‌مه‌د

لاپه‌ڕێن خوه‌ مینا دلێ من ڕه‌ش نه‌كه‌،

هه‌تا پێنوسێ ته‌ مینا ئارمانجێن من شكه‌ستی نه‌مینت !

## کۆریٚ نەفتیٚ

زارۆك لسەر کەناریٚ دەریایی دنڤن،

گەمیڤان،

ب تابۆتان سواری پیٚلان دبن!

ماسی،

خوەپیٚشاندانیٚ دژی نەهەنگان دکن !

ڕەوڕەوا سەیان،

ناهیٚلت بلبل ب ئارامی میوزیکا خوە ب ژەنت.

گولیٚن باخچەیی، ژبەر مرنا ئاڤیٚ

هشکاتییٚ دخوون.

ئوكسجين،
پێكولان دكت ژ نهۆمێ ئوزونێ دەربكەڤت !
بالندە دخوازن،
د دەريايى دا بژين،
و ماسى دخوازن بفڕن !
نەفت، ژبەر پرسا ئاڤێ
كراسێ ڕەش لبەر ژيانێ دكت،
ئەو نزانت هێشتا ژيان سنێلەيە
و مرنا وێ بەندەيە،
ياخى نەبوويە.





## پشتا تابلۆییٚ مۆنالیزاییٚ

من نەزانی زیندییەك جوانی،
بێهنا مرییان ژته دهێت،
گرانیا ته ئاخا ل بن پییێن من دئێشینت
و بێدەنگییا من، وەك پرتەك پاتەی د چاڤێن ته دا
دگەل بێهنشكێن زارۆكان دلڤت،
مینا تابلۆییٚ مۆنالیزاییٚ بووم،
لێ تۆ ژی بوویه (بیروجی)[١]
ته ئەز دزیم
و كەتم د دەستێن زارۆكێن جادەییێن دلێ ته دا
تژی خیچ و پنی كرم
ئەی (داڤێنشی) كانیٚ تۆ ؟




وەرە من نویژەن بکە،

جارەك دی بسانەهی ناهێم دزین !

١ ـ بیروجی: گەنجەکێ فرەنسی بوو ل سالا ١٩١١ تابلۆیێ مۆنالیزایێ ژ موزەخانەیا (لۆڤەر) دزیی بوو.





## ژیان د تابۆتیٚ دا

دیاری بۆ وی ئاگری یێ تە ئافراندی، داکو زارۆکێن بێ گونەهـ هەمبێز بکت !
دیاری بۆ وێ بەهشتێ، یاکو تژی د مە دا کرییە ڕەژی و مێشکێ مە بەرەڤـ فانتازیایێ بریی !

هەڤڕکیا مرنێ دگەل زەمینێ دەستپێکر،
ئاگر پێکولان دکت بای هەمبێز بکت،
دا هەر تشتی د خوە دا بکت ڕەژی !
ئەزمانێ ژیانێ د دەڤی دا شووڕ بوو
ڕەنگێ ئاسمانی د چاڤێ دەریایی دا هندابوو،
سیتافك یێن گۆڕێن خوە دکولن،



زارۆكەك یێ ل سەر كێلیا خەونێن خوە ڕوینشتییە خوار
و ستێران وێنە دكت !
ڕاستییێ سەرێ خوە برە هنداڤی پەنجەرەیا ئاسمانی،
دا گازندەیا بگەهینت،
لێ نەیزەكەك ڤێ كەڤت
و كەلەخێ وێ ب ئاخێ كەت !
ئەی گەردوون، زەمین هەموو بۆ تابۆت !
ڕوندكەكێ لسەر لاما خوە ببارینە،
دا ڕاستی ژ كەلێژیا خوە شوین ببت،
و جارەكا دی كاتان بدت.
ئەی هەتاڤ كراسێ خوە هلبدە
و لدور هێلا خوە سەمایێ دگەل ئەختەران بكە،
دا هەر تشت د كەڤلوژانكێ خوە دا ڕۆهن ببت
و خوە نوژەن بكت.
ئاخ تۆ ....؟
دێ ژ ئاسمانی وەرە خوار
و پییێ خوە بكە د دەڤێ ئەڤێ دوزەخێ دا
كا دێ هێیە سۆتن ؟
یان ژی ئەو دێ بێژت (هل من مزید) !




## برینا تارییٚ

د ئەڤیٚ خەلوەتگەهـ و بەندەمانا ئەزەلی دا،
مژاریٚن بیٚدەنگییێ، پەیڤان سیٚدارە ددن.
دناڤبەرا ژیانەك بیٚهودە و مرنەك یاخیبووی دا،
گۆیا زەمینی یا مەست، ترانا ب دەمی دکت !
دەم ژی ترانا ب مە دکت،
و مینا کەسەك ڕەڤوك د بازنەیەکیٚ دا،
مە ل دویڤـ خوە ڕادکیٚشت.
دا کو ئەزمانیٚن مە گوهان ببینن،
ئەم دشیٚن د ئەڤیٚ شەڤیٚ دا
چرایەکیٚ، وەکو خەنجەران ل پشتا تارییٚ بدن !
لیٚ، ئەو خوینا ژ برینا ویٚ دهیٚت،
تیٚرا ڕوهنکرنا دەوروبەریٚن مە ناکت !





ئەم دناڤا خوە دا، پێدڤی ب هەلاتنا هەتاڤەکێ نە.

دا د ئاڤابونێ دا و ب دیدارا هەبوونا مە

هەیڤ خوە بخەملینت.

ئەو جوانیا ب ڕویەکێ  گرنژینێ ددت مە،

و ب ڕویێ دی ئاموژگاریان ل تاڕیێ دکت،

لێ تژی د بیردانکێن مە دا سیمبۆلن،

و ئەم یێ د دەرازینکێن تاڕیێ دا ل کلیلان د گەرن !

و دەرگەهان ل پشت خوە ل تاق دهێلن !

ئێدی سیتافکێن مە ژی ژ مە د ڕەڤن،

دبن  پارچەیەك ژ ڕۆناهییێ

و ئەم دبن دلۆپەك تژی ژ هشکاتیێ،

ب کێلیانڤە دهێن خوار

و ڕویێ ئاخێ ڕەش دکن !

د ئەڤێ  بیرێ دا

دەستێ خوە بگرە

و ڕابە لسەر پیێن خوە،

ل بەندەمانا چ کاروانیان نەمینە داکو بهێن

و کنفەکێ بۆتە بهاڤێژن د بیرێ دا،





ژبەرکو کاروانیان ب ڕێکی ڤه دەستێن خوه یێن فرۆتین.
پێنوسێ خوه هەلبگره و لسەر تابلۆییێ هەبوونێ،
هەر تشتی ب حەزا خوه وێنه بکه،
جیهانەك نوی،
ژیانەك نوی،
مرنەك نوی.

# خەونەك 3D

**تۆ چ بوونەوەری ؟**

**تە نابینم و هەست ب هەبوونا تە دكم !**

**خوە ڕاڤەكەرێن خەونان ژی،**

**نەشێن ئەڤێ چەندێ ڕاڤە بكن !**

**چ لێگەڕان ژی ئەو شیان نینن،**

**ل ئەڤێ جیهانێ ل تە بگەڕن !**

**دبت ئەز ڕاستییەك بم د خەونێ دا !**

**و دبت تۆ ژی د خەوەك بێ دووماهیك دا بی،**

**ئەگەر وەها بت،**





**هێدی ... هێدی**

**چاڤێن خوە ڤەکە،**

**دا ژ تە بکەڤم**

**بەلکو ببی ڕاستی !**





# ڤێرییێن فیشەکان

لەشێ وێ یێ بوویە گۆرستان
و مری کێلیان د دزن،
زارۆکەك یێ ل بەر سینگێ وێ
سیتافکا مەمکێن وێ دمێژت،
و جارنا بۆ د پەرخینت !
گرنژینا وێ یا ژ لێڤان کەڤتی و
پرت پرت بووی،
ڕوندکێن وێ یێن بژالە بووین
بێهنا خوینێ یا ژ تڤەنگا برا زاڤایی دهێت،





**ڤێرییێن فیشەکان ب سەر گەردوونیٚ کە ڤتن و**

**هێشتا کەس نزانت،**

**د**

**ە**

**و**

**ل**

**ە**

**ت**

**ژ کچینییٚ کەڤت !**





## دەستخەتێ مرنێ

من ڕێكا چوونێ هەلبژارت،

بۆ كويڤە بچم ؟

چ تشت خويا نينە !

پشتی ب ڕێكەڤتيم،

د ڕێكێ دا من لاندكەك ديت !

من گۆتێ: ئەڤ ڕێكە بۆ كويڤە دچت ؟

گۆت: بەرەڤ زارۆكينيێ،

د ڕێكا زارۆكينيێ دا،

من خەونەك مری ديت !





د زکیَ خەونیَ دا
ڕاستییەك هەبوو،
د ڕێکا ڕاستیێ دا وەستییام،
لبەر دیوارێن ڕاستییێ د خەو چووم !
د خەویَ دا،
من مالا سیاسەتیَ دیت،
دناڤبەرا سیاسیان دا،
من کورسیەك دیت،
ل پشت کورسییێ،
من تابۆتەك دیت !
د تابۆتیَ دا
من شۆرەشەك دیت،
د شۆرەشیَ دا،
من ئازادی دیت !
د ئازادییێ دا،
هەمی ڕێك لبەر من هندابوون !
د هندابوونیَ دا،
بەرەڤ ڕێکا نەبوونیَ دچووم !
د نەبوونیَ دا،





من دیوارەك دیت،

نێزیکی دیواری دبووم،

من تەماشەکر،

لسەر دیواری

ب دەستخەتێ مرنێ نڤێسیبوو

ژیان تشتێ بێ بوهایە !

من ناڤێ ژیانێ ژێبر

و ب دەستخەتێ خوە نڤێسی مرۆڤـ !

پاشان، من دەستێ خوە گرت و بەرەڤ لاندکێ چووم !





# مێزگەردا  ئەهریمەنی

**دەما تو دهاتی،**

**د بوویە سیتافکا من و ئەز دبوومە سیتافکا خوە،**

**لێ د ڕۆژئاڤابوونێ دا، ئەم هەر سێ مرن !**

**د مرنێ دا ئەز بن ئاخ دبووم،**

**تو دبویە هەلم،**

**د ئەڤێ کارلیکا دووم درێژ دا،**

**من دخوازت بفڕم و بەرەڤ تە بهێم،**

**لێ د گۆتن د ڕێکا تە دا پرەك هەیە،**

**مینا داڤێن پرچا تە زراڤە،**

**کانیەك لێ هەیە، مشتە ژ دوژەهێ**

**ئەرێ ما تو بوویە بەهشت ؟**





من تو دڤێی،
ژ بۆ نێزیکبوونا تە،
دخوازم د ڕۆژێ دا پێنج کرنۆشان ببم !
مەهەکێ بکم قەیران،
لێ دبێژن خوە د گۆرستانێ دا بتەقینە،
دێ د نەقەبا جووت مەمکێن تە دا مەیی زێت،
فریشتە دێ سەر مەست بن،
ئەرێ ما تو بوویە حوری ؟
وەها ئەز د تەقام
و دناڤا سەر مەستان دا
تە بمن دکرە کەنی !
و سەما دگەل ئەهریمەنی دکر،
هەتاڤ توڕە دبوو د هەلات،
ژ ترسێن وێ دا
هایدار دبووم !




**ل بەر پەنجەرەیا بەهشتیٚ، خەونێن من ل پێش چاڤێن من د سۆتن**

بێژە یوونس بێغەمبەری،
بوچی تو چووی
و تە ئەو هێلان د دەڤیٚ نەهەنگی دا،
چ نەمایە دیٚ د گەوریا وی دا چنە خوار !

گۆپالیٚ مۆسا پێغەمبەری بۆ من فرێبکە،
دا ل نەفتا ئەڤی وەلاتی بدم،
هەمی یی دناڤ دا د خەندقن !





بێژە عیسا پێغمبەری،
ژ ئاسمانی بهێت خوار،
تو د بینی چەوا دەجال یێن کەفتینە د بەرویکێن مە دا !

بێژە یۆسف پێغەمبەری،
بلا بهێت خەونێن مە ژی ڕاڤە بکت،
دەمە هشکە سالی ب سەر مە ژی دا بهێت !

بێژە ئەبراهام پێغەمبەری،
بلا بهێت ئەڤان پەیکەرا بشکێنت،
تو یێ د بینی چەوان ئەم یێن کرینە بەندە
و بازرگانییێ ب مە دکن !





## کی هەیە پیرۆزیان د ناخیٚ من دا تافیٚل بکت ؟

**نوکە مریەکم**
**ئیٚك یێ کەلەخیٚ من دشوت،**
**هەر ئەوە**
**دەمیٚ ئەز یێ زیندی**
**هەمی پیرۆزییٚن من د من دا "حەرام"  کرین !**

**نوکە د تابۆتەکیٚ دا مە،**
**ل سەر ملیٚن هندەکان،**
**هەر ئەون،**
**ییٚن چ جاران د ژیانیٚ دا دەستیٚ من نەگرتین !**





نوکه یێ من بن ئاخ دکن
و (( " دعا " یان دکن بچم بەهشتێ،
هەر ئەون،
دەمێ زیندی، ژیانا من کرین دوزەخ ! ))

نوکه ئەو چوون،
و دەنگەك دهێت،
دبێژت: خەمگین نەبە (نحن السابقون و هم اللاحقون )
من گۆتێ بۆ کیڤه ؟
گۆت: نزا !




## سێڤەك ژ گەردوونی كەڤت، دووكەر بوو، كەرەك ل ڕۆژئاڤایی ما و یا دی ل ڕۆژهەلاتی كرمان خوار

ئەی ئەهریمەن،

دێ وەرە كرنۆشەكێ بۆ من ببە،

دا جارەكا دی ئەوێ سێڤێ نەكم !

ئەی حەوا،

دێ وەرە ببە تەنشتا من یا ڕاستێ،

دا جارەك دی ژ هەڤدوو دویر نەكەڤن.





ئەی زولەیخا،

دێ وەرە من ژ زیندانا (زاویرا) ڕزگار بکە،

دا چاڤێن تە ڕۆهن بکم.

ئەی تو،

دێ وەرە ئەز و ئەز،

تو و تو،

ب بنە ئەز و تو

و پێکڤە بژین.





## دەمىَ خوديك دوو گيان دبت

ئەڤ شەڤە،

يىَ ترِانەيان ل بىَ ئاقلييا خوه دكم،

رِاوەستييايى مه و دگريم،

ئەزىَ د خوديكىَ دا، بمن دكەنت !

دەستىَ خوه دئينت دەر و رِۆندكێن من پاقژ دكت !

رِەنگىَ خوه دگهورت دبت لێبوك،

يارييێن پەهلەوانان دكت.

جاران ژى مينا زارۆكان لسەر چالەپكا دچت،

ئەز دگرنژم و دەستىَ خوه نێزيك دكم،

لىَ دەڤىَ وى دلڤت و رِەنگىَ وى سۆر دبت،





بەلێ من گوهلێ نابت.

خوە دگهورت دبت پیرەمێر،

و کوپالێ خوە لسەرێ من ددت،

دبێژت خوە ئاقل بکە !

خوە دگهورت دبت فریشتە و ل هنداڤی خوە دفڕت،

پێکولان دکت دەربکەڤت،

لێ ب شوشەیێ دکەڤت !

خوە دگوهۆرت دبت ئەهریمەن،

دیمەنێ ل پشت خوە تاڕی دکت،

و نینوکا خوە دئێخت شوشەی،

پێدا دهینت خوار،

خسێنیێ ژێ دهینت.

ئەز د ڤەجنقم،

پشتا خوە د دمێ،

ژ خوە سل دبم،

لێ تەپەکێ ل ملێ من ددت،

دبێژت:





چاڤێن تە یێن ماندی بووین،

ئێدی بەریٚ خوە نادن من.

دەست دکت چاڤێن خوە

دبێژت:

هەر دوو چاڤێن من ببە،

من دڤێت پیٚ بەریٚ خوە بدم خوە،

و چاڤێن خوە بخوینم.

دویڤ ڕا دەستیٚ خوە دکت ئەزمانیٚ خوە

دبێژت:

ئەزمانیٚ من یێ کەڕبوویی، ئێدی گوهێن من دئاخڤن.

دکت گازی، من ئەزمانەك دڤێت گوهداریا بێدەنگیا من بکت.

خوە دگهورت، دبت نوژدار و بیهستوکیٚ ددانت سەر سینگیٚ خوە

دبێژت:

یا بیٚ ڕامانە، نکارت گوهداریا ئازاران بکت،

بیردانکا دلیٚ من یا تژیبووی ژ سەلیقەیان،

وەرە پەیاسەیەکیٚ د من دا بکە،

خوە یێ پیر د لاندکیٚ دا ببینە !




وەرە ل پشت من چیاییێن ماسکان ببینە،

لێ ل ڕوییێ خوە نەگەڕە،

ژبەرکو ییێ هاتیە دزین.

وەرە لسەر جاددەییێ لێدانێن دلی خوە ب هەژمێرە،

تێرا دەمژمێرەکێ ب تنێ ییێن ماین.

ل دووماهیك چرکە پاتریا دەمژمێرێ دەربخە،

دەستێ من بگرە و من ببە دەڤ من و من بۆ من بدە نیاسیین،

دا بێژم:

دناڤبەرا من و من دا،

کەسەك ییێ ڕوینشتییە خوار،

پشتا وی ل دیوارێ تنێبوونێیە،

ملێ وی ب ملێ تاڕییێ ڤەیە،

د گوهی دا، سترانێن بێدەنگییێ دسترینت،

و د بێدەنگییێ دا چاڤەڕێی کەسەکێ یە،

ئەو کەس ژی هەر ئەزم.





## ل بازاریٚ هه زارۆك گۆپالان دفرۆشن !

ل پشت دیواریٚ هه،
کچەك ڕاپیٚچایی ب جلیٚن ڕەش،
خیٚلیا خوه هلددت و لیٚڤا خوه دگڤیٚشت،
کورەك ویٚ ماچی دکت !

ل سەر جادەیا هه،
کچەك کراس هلدایی دبۆرت،
کەسەك ئۆلدار نەفرەتیٚن خودیٚ لیٚ دکت !




ل ئەویٚ ئوفیسا هە،
پاقژکەرەك،
هەموو سپێدەهییان، ستیانەکیٚ ل بن مێزیٚ ڕادکت !

ل ویٚ مزگەفتا هە،
کەسەك،
بەراهییا هەموویان نڤێژا خوە ب دووماهیك دهینت،
و جووتەك پێلاڤێن جوان ددزت !

ل ویٚ مەیخانا هە،
کەسەك،
شووشا (ڤۆدکا) ییٚ  ب سەریٚ خوە دا درێژت،
دبێژت ڕەوشەنبیرم  ڕەوشەنبیر !

ل بن ئالاییٚ هە،
کەسەك سروودا نشتیمانی دبێژت،
و زارۆیەك بیٚ خوەدی،
پێلاڤا وی بۆیاغ دکت !




**ل ڤێرێ ئەز ژی**

**سەرێ خوە دهەژینم،**

**دەستی خوە ب برینا خوەڤە دکم،**

**و سێ بەرا لدویڤ خوە دهاڤێژم !**





## لێدانێن دلێ تە گۆهێن ئاسمانى كەڕ كرن

ل هەر دەمێ،

پيێن من شيان مابن ئەڤێ ئاخێ بئێشينن،

دێ ل ڤێ گۆيا زەمينێ ل تە گەڕم.

هەر جهەكێ ب گەهمێ،

دێ پارچەيەكێ ژ لەشێ خوە بۆ تە ل وێرێ هێلم.

دەما دگەهم چينێ،

دێ فەيسێ خوە ب ديوارێ وێ ڤە هەلاويسم،

بەلكو جارەكێ تە دناڤ گەشتياران دا ببينم !

پاشى دێ بەرەڤ مۆسكو چم،

دا گوهێن خوە ب هەيڤەكا دەستكرد ڤە گرێبدم





و فرٚیکم ئاسمانا،

ژ بۆ گوهداریا شەپۆلێن دەنگیٚ تە !

دیٚ هەمی رٚیکان برٚم،

دەما دگەهم زالتسبورگیٚ، دیٚ ل بەرامبەر موزەخانا مۆزارتی راوەستم.

دیٚ ب دەنگەك بلند بێژم: تێلێن دەنگیٚ من یێن زراڤبووین،

د خوازم ببم میوزیکەك و د ناخیٚ گەردوونی دا ب بارم

دا هەمی جیهان پیٚ ئاگەهـ بت،

دەمیٚ عەشق ژ خوە دەردکەڤت،

هەسارەیان سەر مەست دکت !





## تێناگەهم !

دناڤبەرا من و تە دا، عەشقە.
دناڤبەرا من و ئەوان دا، سیاسەتە.
دناڤبەرا من و خوەدێ دا، ئاینە.
دناڤبەرا من و من دا، فەلسەفەیە.
د ناڤبەرا عەشق و سیاسەتێ،
ئاین و فەلسەفێ،
زانستە.
عەشق ژ وێڤە هات،
سیاسەتێ پەیمانەك دگەل گرێدا
ئاینی گۆت : " حەرام " ە.





فەلسەفیٚ گۆتیٚ : بۆچی ؟

زانستی ڕۆبۆتەك ژیٚ دروستکر !

سروشت تۆڕە بوو،

ڤۆلکان تەقین،

ئۆکسجین نەما،

گۆیا زەمینیٚ ژ هیٚلا خوە دەرکەڤت،

کەس د ژیانیٚ نەگەهشت !





## شێست چرکە ژ دەمژمێرا داویێ

خوەدێ ڕۆمانان دنڤیست !

فریشتە ل ئەسمانی

یاریا گرتنا ڕۆحان دکن !

گیانەوەر زارۆکێن خوە،

فێری زمانێ ئەجنەیان دکن !

ئیبلیس یاخی دبت

و سێڤان دخوت !

کارکێن بزنان،

گوهانێن مێ گورکان دمێژن !

و تێشکێن گورکان،

داڤێن گیایی دخون !





بێنج مشکێن لاواز،
پێنج پشیکێن قەلەو دخون !
پێنج چێلێن ڕەش،
پێنج چێلێن سپی دخون !
دەریا کراسیَ سۆر لبەر خوه دکت !
شەڤ،
هەتاڤیَ د پاخلا خوه دا د ڤەشێرت،
هەیڤ دووکەر دبت،
ڕوییَ گەردوونی،
وەکو ڕەنگیَ ئاگری لێدهێت !
دناڤا هەمی سەنگەراندا،
بێهنا سینگیَ دایکان،
فیشەکان سەر مەست دکن !
مرۆڤ،
خوینا هەڤدوو فڕ دکن !
و دبێژن:
نووش بۆ بەندایەتیَ،
نووش بۆ بیَ هوشییَ،
نووش بۆ ونداکرنیَ !




## دەمێ بۆسەلە ڕێیا خوە وندا دكت

پشتی د مالبچویكی دا دەركەڤتیم،
بۆسەلەیەك ب سینگێ منقە بوو،
گۆت: ڕێیەكێ ب هەلبژێرە،
من گۆتێ كیژان ڕێك؟
گۆت: ڕێیا زارۆكییێ،
د ڕێیا زاروكییێ دا،
من بویكەك پاتەیی یا دڕیایی دیت،
من چووتەك دەستبلینكان دیت،
ب ڕەنگێ ڕەش خوویا دكرن !
د دەستێن پیرەژەنكەك پۆرسۆر دا،




من نانەك كیفكویی دیت،

ل بەرامبەر تەنویرەکێ ڕوینشتیبوو،

ژ دێمێ وێ پرس و سەرسامیی دپەشین،

بۆسەلەییێ ستوییێ خوه خوارکر !

گۆت: بۆ ئەڤێ ڕێییێ هەرە

د ئەوێ ڕێییێ دا،

دبووم هەژارەك،

و لبەر دەرازینکا پەرستگەهەکێ،

من گۆپال لسەر پیرەمێران بەلاڤە دکرن !

ل سەر جادەیان،

من خوها ترافیکان،

ب کلینسان پاقژ دکر.

ترافیکێ ڕەنگێن خوه یێن سۆر و زەر،

تێکەلی هەڤ دکرن،

ڕەنگێ کەسك ژێ دروست دبوو،

لێ چ کەس پێشدا نەچوو !

ترافیك د حەلیا،

کەسکاتی زەر دبوو،

هشکاتی ب سەر جاددەیان دا درێشت !

ب تنێ سنێلە دناڤ دا دخەندقین.





بۆسەلەیێ چاڤێن خوە گرتن،
د رێیەکا خەلەت دا چووم.
پیێن من هلنگڤتن،
بۆسەلەیێ چاڤێن خوە ڤەکرن،
ئەز یێ دناڤ سیاسەتمەداراندا،
بۆسەلەیێ ڕکا خوە ل کورسیێ گرت !
من کورسی شکاند !
بۆسەلە تورە بوو،
ژ سینگێ من کەڤت،
من هێلا د ڕێکێدا،
من ڕێیا دروست هەلبژارات،
بۆ ناخێ خوە ڤەگەریام.





# پشتا تابلۆییٚ دوزەخیٚ

دیاری بۆ د. محەمەدعەلی یاسین تاها

نزانم دگەل خوە هەڤوەغەرییٚ بکم،
یان ژی د ناخیٚ خوە دا وەغەریٚ بکم.
نزانم سیهوانەیا خوە یا ڕویس بکم د دەستێن خوە دا،
و لسەر پرا سیراتیٚ،
لبەر بارانەك هشك،
پیاسەیان بکم !
یان ژی توزا د چاڤێن بای دا ڤەمالم،





و دگەل هەڤوەغەرێ دوزەخێ بم.
ئەرێ ئەز باش دزانم، دێ وەكو هەمی جاران
د دیدارا خوە یا ئەزەلی دا بێی تە مینم،
و دێ كەلشێن دیوارێ بەندەمانێ دەرمان كم،
بێژنە من كی دێ ئەڤان دیوارێن ستو درێژ هەرفینت،
داكو سیڤیانوك د كەلشێن وان دا هێلینێن خوە دروست بكن !

١٢ - ٣- ٢٠١٦





**تژی د من دا جەهنەمە و من بەهشت دڤێت،**

**تژی د تە دا بەهشتە و د جەهنەمێ دا دژی،**

**ژ مە هەردوویان کی دهێتە سۆتن ؟**





تو چوویی،
تە خوە هێلا د ناخێ من دا،
بێریا تە دکم،
بەلێ، گەلەك ژ من دویری،
ئەرێ ما د ڤێت چەند سالێن ڕۆناهیێ ڤەبڕم،
هەتا بگەهم د ناخێ خوە دا،
و قەستا دلێ تە بکم !

میوزیکەکم ژ ئامیرەکیٚ،
ب دەستیٚ لاوەکیٚ دهیٚم ژەنین،
ب دەنگیٚ من،
ڕۆحیٚن هەوە بەختەوەر دبن،
و پاریٚن هەوە بیٚ بوها دبن !




دا بەس ئاگران د دلێ ئێك دا هەل بکن،

ڕاستە ژێدەرێ ئەلماسا ژ ڕەژیێ یە،

و ژێدەرێ ڕەژیێ ژ سۆتنێ یە،

لێ هەر تشتێ دهێت سۆتن نابت ڕەژی،

و هەمی جورێن ڕەژییێ نابن ئەلماس !





تۆ بلبلەك خەمگینی د قەفەسەك ژەنگی دا،
ئەز لاوەکێ هەژارم نانی دخوازم،
نە من کلیلا بەختەوەریێ بۆ تە بدەستڤە ئینا،
نە ژی تە سروود بۆ ئازادییێ خواندن !

ئەی شەڤ،

کراسێ خوە هلبدە،

بەختێ مە، یێ ل هنداڤی پییێن تە وندابوویی !





تۆ یا د من دا و ئەز یێ د زکێ شەڤێ دا،
نه تو دیاربوویی نه ژی هەتاڤێ سەرێ خوه هلدا !





**ئەی مرن،**

**ژ ئەڤی وەلاتی کوچبەر ببە،**

**ئێدی کەس تابۆتا من هلناگرت !**





د جەنگی دا
بنیٚ دارەکیٚ ژ خوینیٚ پر دبت،
دەم دبۆرت،
ڕهێن ویٚ خوینیٚ دمێژن،
و کرم بەرهەمیٚ ویٚ دخون !




ژ هەر تشتی ب تنێ بێریا تە دکم،

بەلێ ژ هەر تشتی ب تنێ من ژ بیر دکی،

ئەرێ من ژ بیر دکی،

و ب تنێترین مرۆڤ د ئەڤی گەردوونی دا دهێلی،

د ئەڤی دەمی دا تشتەك بێ هەر تشتم،

و تو هەر تشتی و تە هەر تشت هەیە،

ب تنێ ئەز نەبم !





ئەز و تو زنجیرە كن،
هەمی ئاسنگەرێن جیهانێ پێكولێ بكن،
نەشێن من و تە ژ ئێك ڤەكن،
ب تنێ زێرنگرەك نەبت !





ئەز گولەکم،

د گولدانا لسەر لێڤا پەنجەرەیا تە دا،

تو ستەمکاری،

دەمێ ڕۆحا من دهەلکێشی

و مرنا من پێشکێشی کەسەکێ دی دکی !





**دیٚ هیٚمە سۆتن،**

**ب تنیٚ وەكو ویٚ تەنویریٚ،**

**یا هەمی سپیٚدەیان، دایكا من نانی تیٚدا بەرهەم دئینت !**





**خوەپێشاندان یا ل گۆرستانێ ڕویدایی،**
**ڕۆحا من یا ژ ئاسمانان ڕەڤی،**
**حەز دکت، بهێتە د من دا !**





**ئەی دەم ڕابوەستە،**

**من نەڤێت د مێژوویێ دا بهێم نڤێسین !**





**ئەی ڕۆندك،**

**دلۆپ ... دلۆپ،**

**ژ چاڤێن من وەرن خوار،**

**ما هوین نزانن ئەز یێ دگریم !**





ئازادی واته ئەز،

ماف واته تو.

هەر داخازەكا ئەز بكم دبت مافێ تە،

هەر ڕێكەكا تۆ خوه تێدا دبینی ئازادییا منه ؟





دبت ئەز و تو هەڤرا نەمرن،

لێ بهێلە ب هەڤرا بژین و ژیانێ ل جیهانێ بەلاڤ بکن.





دایکا من دلنازکە،

دەما قەستا باغچەیی دکت،

گۆل تورە دبن،

ژبەرکو پەلاتینك لسەر کراسێ وێ د ڕوینن !





من دەستێن خوە بلندکرن،

دا دەستەك دەستێ من بگرت،

ژ هەمی نڤێسینێن ل سەر ئەنیا من،

خوەدێ پەیڤا تنێبون هەلبژارت !





ڕۆندکێن ئاسمانی بوهاریٚ دئافرینن،

ڕۆندکێن ته پاییزیٚ دئافرینن !





دلێ من  ب تنێ یە د سینگێ من دا،
تۆ ژی وەرە،
پشتا خوە بدە پشتا وی و بڕوینە  !




هەر تشتیٚ خوە دیٚ ب تە بەخشم،
ب تنیٚ بۆ من ببە تشتەك،
کو چ کە س نەشیٚن بدەستڤە بینن !




تو وەکو چیایەکێیی،
ئەز ل هنداڤی تە بالندەیەك بچویکم،
چەندەکێ خوە نزم بکە،
ئاسمان تێرا من و تە هەردوویان ناکت !




سێڤەك ژ دارێ کەڤت،

دووکەر بوو، کرمەك ژ نیڤکا وێ دەرکەڤت،

گۆت: ئەز ئەهریمەنم !





چەند درەوەكێ بكت،
پرتەك ژ ئەزمانێ وى دكەڤت،
ل دوماهییێ هەولدا ڕاستییێ بێژت،
شیان نەمان باخڤت !





پەشیٚمانم، هاتی مە ئەڤیٚ دونیاییٚ،

من دڤیٚت بچم زەمینەیەك دی،

ئەز ل ویٚریٚ نەبم !





هەر جارەکا تە ڤیا من بهێلی،

ل بەر خۆدیکێ ب بێدەنگی هزر د مرنا من دا بکە،

دێ بینی چاوا ئەز دێ ژ چاڤێن تە هێمە خوار !





ژوورا من پڕە ژ من،

و د من دا پڕە ژ تە،

وەرە خوە پڕ بکە ژ من،

ئێدی ژوورا من تێرا من ناکت !





ژ تە حەز دکم،

پتر ژ وی تشتی،

ئەوێ تۆ ژ هەمی تشتان حەز ژێ دکی !





**چەوا تو دلیٚ من دخوینی،**

**هیٚشتا ئەز د زمانیٚ دلیٚ خوە نەگەهشتیمە !**





**ب پەیڤێن شەوتی،**
**ئەزمانێ خوە نەکە ڕەژی،**
**ب پرتەکا ئاگری تاڕیاتیا د دلێ من دا ڕۆهن نابت،**
**ئامۆژگاریان ژ هەتاڤێ وەربگرە،**
**و وانەیا ژ هەیڤێ،**
**تو دبینی چەند ب بێ دەنگی**
**کارلیکێ دگەل هەڤدوو دکن !**





تۆ خالەیا چونه بوویی،

ئەز ژماره ئێك بووم،

ب هەڤرا، مه پلەیا دەهـ ژ دەهێ ب دەستڤه دئینا،

لێ تو چوویی و ته خوه ژ من دویرکر،

ب تنێ هێلام و هندابوویی،

ته ژبیرکر کو د یاسایا بیرکاریێ دا،

دەهـ ژێ پچن چونه هەر دمینت دەهـ !





ژ دیمەنێ ل پشت خۆدیکێ دترسم،
ژبەرکو ڕەنگێ تە کرێت نیشانددت !




ئەی خوەدیَ،

خەمگینم هندی کێشەیا قەبارەیا گرانیا تە،

بەختەوەرم هندی کێشەیا قەبارەیا سڤکاتیا ئەڤان مرۆڤان !





گۆت من: ئەگەر بخوازی، خوە ب بۆنەوەرەك دیتر ب
گوهۆری،
دێ چ بۆنەوەر هەلبژێری ؟
من گۆت: دا هەر مینم مرۆڤ، ب تنێ دا کەلەخێ خوە
گوهۆرم !





من  یا دلێ خوە بۆ تە نڤیسی،
ڕێیەکێ بۆ من ببینە، ڕۆحا خوە بۆ تە بنڤیسم !

دەمێ دمرم، بڤرەكێ بكن د دەستێ من دا
و ب پاتەیەكێ سۆر من كفن بكن،
من دڤێت ئەوێ دارێ ببڕم !

عەشق...

ڕامانا ویٚ تو

چەند بژیم،

عاشقم بۆ تە

چەند هەبی

چەژنی بۆ من.

لێڤێن من هشك بوون،

بێهنژینەك شەرمین یا دناڤ ددانێن من دا ئاسێبوویی،

دترست مژویلانك خوە ڕویس بكن !





من دڤێت هزر بکم،
کو ئێدی هزرێن چ تشتی نەکم !





ئەی گول،
دگەل بێهنا خوە بفرە،
و وەرە د دەستێ من دا !





**هەردەم پێکولێ دکم، ببم دوماهیك چرکە،**

**ئەوا دبت دەستپێك بۆ خۆلەکەك دیتر !**





د خوە دا پەنابەرم،

و ژ دەرڤەیی خوە بێ وەلاتم،

وەرە دا د چاڤێن تە دا ئاکنجی ببم !





من گوتیٚ تیٚهنیمە،
گوت: " دعا " یان بکە باران بهیٚت.
چوو،
ژ چاڤیٚن من ڕۆندك بارین !

ل بەندا كێ بمینم،

تە،

یان ژی خوەدێ !

دا كو بهێت،

و ئەڤێ دوزەخێ د من دا بڤەمرینت !





من گۆتیٚ ته دڤێت بۆ ته چ بێژم،
گۆت: بێدەنگ بە !
ئەز بێدەنگ بووم،
ویٚ تلێن خوه کرنه د گوهێن خوه دا !




گۆت من:

تە ئەز دڤێم یان بەهشت !

من گۆت: تو !

ئەز هێلام،

ژیانا من هەمی بۆ دوزەخ !

میۆزیکەکم ژ ئامیرێ کەمانێ،
د بنێ دەریایی دا،
ب دەستێن پەرییەکێ دهێم ژەنین.
ب دەنگێ من،
ماسی عاشق دبن،
و دگەل پێلان سەمایێ دکن !




دێ وێنێ خوە ب دەرگەهێ مالا خوە ڤە هلاویسم،

بۆ ئەوان کەسان یێن دخوازن من ببینن !

ئێدی من نەڤێت ئەوان ببینم،

یێن ئەز دخوازم ببینم،

ئەون یێن چ جاران نەهێن !





شرینییێن جەژنیَ،

ئاستیَ شەکریَ د خوینا من دا بلند کر،

و بیَ هوش کرم.

پشتی تۆ هاتی،

لەشیَ من ژ هێزیَ پڕ بوو،

و هوشدار بووم.

د ئەڤیَ کارلێکیَ دا،

من ژ نوی زانی،

هۆرمۆنیَ " ئەنسولین" یَ ژ لێڤێن تە دروست دکن !





وەلاتەکێ د من دا،

ئاخا وێ پەمبی لێ شوین دبت،

و ئەزێ د وەلاتەکێ دا،

ئاخا وێ هەمی تەختن،

بەلێ هەتا نوکە پێخاسم،

و پییێن من تژینە ژ ستریان !





من دەستێن خوه کرنه د بەرویکێن خوه دا،
پارێن من هاتن دزین !
من دەستێن خوه بلندکرن،
هەردوو هاتن بڕین !




سینگێ تە گولخانەیە،
و لێڤێن من ئاڤدانکن،
وەرە دا ڕها تەڕ بکم،
بەری ئەو گۆل بچرمسن !





تژی د سینگیٚ من دا ئاگره،
ژ دەوروبەریٚن خوە هەست ب سەرماییٚ دکم !
ئاخ ژ بیٚ ئاگەهیییٚ،
ئەریٚ ما بیٚهنا سۆتنیٚ ناهیٚت هەوە ؟




به س خوه نێزیکی من بکه،
دلێ من وەکو جەهنەمێ یە،
دبێژت: (هل من مزید) !




ئەو حەز ژێکرنا من دایە تە،
من پێشکێشی خوەدێ کربا،
دا بەهشتێ کتە د دلێ من دا،
بەلێ تۆ چوویی،
جەهنەم تێدا دروست بوو !

**بگەهن من،**

**میلێ دەمژمێرێ ژ دلێ من کەڤت !**

دناڤبەرا جەهنەما من و یا خوەدیٚ دا،

ب تنێ دوو جیاوازی هەنە،

جەهنەما خوەدیٚ،

ئەز د سینگیٚ ویٚ دا دسۆژم !

و جەهنەما من،

من د سینگیٚ من دا دسۆژت !

جەهنەما خودیٚ،

ئاگریٚ ویٚ ب مرۆڤان هلدبت !

بەلیٚ یا من،

مرۆڤ ئاگری تیٚدا هلدکن !





**هەست زمانێ لەشی یە،**

**ئاگەهداریان د بەرجەستەکرنێ دا،**

**ب مە ددت.**

**خوەشتڤییا من،**

**کا خوە ڕویس بکە،**

**دا هەمی ئەندامێن لەشێ مە ئاگەهدار بن،**

**و دگەل هەڤدوو ب ئاخڤن !**





وەرە،

ب هەمبێزەکێ،

ڕۆحا من مەساج بکە !

من هزر د گەردوونی دا دکر،
ئەز د خوە دا بەرزەبووم !
کا بێژن ناسایێ،
نوکە ئەز ل کیژان ئەختەری دژیم،
و ل سەر کیژان هێلێ دزڤرم،
نزانم ئەز د گەردونی دا مە،
یان گەردون د من دایە !




چاڤەرێبوون،
هەوایێ جەهنەمێیە،
ل شوینا ئوکسجینێ،
ئەز وێ دهەلکێشم !




**خوەدێ،**
**بێژە نۆح پێغەمبەری،**
**بلا تابۆتەك مەزن بۆ كوردان دروست بكت،**
**ژبەركو د ئاخا وەلاتێ وان دا،**
**جهێ ڤەشارتنا جانگۆریان نەمایە !**





ئەم دوو پرتیسکێن بچویکن،

ئەز هێدروژینم،

تۆ ئوکسجینی،

وەرە،

د چاڤیٚ ژیانیٚ دا

ب هەڤرا پێکهاتەك کیمیایی دروست بکن،

و ب ڕوییٚ ویٚ ڤە بهێن خوار،

دا هەر تشتیٚ هشکبوویی، شوین ببت !




**کچەك د سینگێ من دا میوزیکێ دژەنت،**

**هەر دەما ئەو بدوماهیك بهێت،**

**ئەز دێ مرم !**





**بەری ئەز ب ئاخڤم،**
**پەیڤێن من دناڤبەرا سەنگەرێ هەردوو لێڤێن تە دا،**
**گولەباران دبن !**

مریەکم،

کەلەخێ من د چاڤێن تە دا ڤەشارتیە،

نەکە گری،

کفنێ من دێ تەڕ بت،

ناخوازم جارەك دی دگەل ڕۆندکان ژ دایك ببم !





پشتی خەونێن مه خرشبووین،

ڕاستی ئیفلنجی بوو،

و ل گۆرەپانا ئازادییٚ پارسەکییٚ دکت !





ئەی دل دەنگێ خوە کێم بکە،
دەمژمێر یا نڤستی !
من نەڤێت هشیار ببت،
ئەز یێ د دەمێ خوە دا هزر دکم !





ئەی دەم،

بۆ نموونە ببێژم:

ئەز دێ سۆبەهی هزر د نوكه دا كم،

لڤێرێ كیژ ژ مه هەر سێیان،

زویتر بەرەڤ پاشەڕوژێ دچت،

ئەز، تۆ یان هزرا من !

پشتی ڕاستی توشی نەخوشیا زەهایمەرێ بوویی،
ژ درەوێ ڕە گۆت:
س
ی
ا
س
ە
ت
م
ە
د
ا
ر
م
!




شاپەرێ پەلاتینکێ مە،
هەناسەیێن بهێنتەنگییێ،
کەلشان ل سینگێ من دروست دکن.





ئەی دەمژمێر،

ب خواترا تە،

ژ کەرەما خوە ب ئازادیی ل پەیی من وەرە !





دخوازم دناڤبەرا دەستپێك و داوییێ دا ئاسیٚ ببم،
ئەز ناڤەرۆکێ دخوازم !




**هەست ب پێشییێ دکم،**

**و هزر دخوەدێ دا،**

**و تشتێ گەلەك گومانێ بو من دروست دکت،**

**ب تنێ مرۆڤە مرۆڤ !**





ژیان،

ئێکەمین سەکەراتا مرنیٚ یە !





ل زەمینێ،

لبەر دەرازینکا مرنێ،

ئادەمی داخوازا فێقییێ بەهشتێ کر،

لێ، ئەو نزانت

حوریان هەمی یێ خواری !





دەم نەمایە،

دیٚ دەمیٚ دەمی ب داویی هیٚت !





ژ بۆ خوەدێ خوە تەڤاند،

نزانی، خوەدێ د دلێ مندا یە !





بەرەك دگریت،

ل دورمانا وی،

قەفتەك گولان شوین دبن.

مرۆڤەك پییێ خوه لسەر بەری ددانت،

گولا ژ ئاخێ دەردخت،

و دبێژت: چەند نازکن !





من هێز نەما،

دەستێ خوە بۆ تە بلند ناکم،

ئەگەر بخوازی لسەر کورسیکێ راببی،

پێدڤیە ڤیاگرایەکێ بخویی !





مرۆڤ دەستێن خوە بەرەڤ ئاسمانان بلند دکن،

و دوعایان دکن.

بەلێ نزانن،

خوەدێ د دلێ من دایە !





گولەك ژ تێهنا دگریت،

ب ڕوندكێن خوە

دهێت ئاڤدان !





ئەو دەستیٚ، دەستیٚ من یێ ڕاستیٚ گرتی،
یێ تە نەبوو،
دەستیٚ من یێ چەپیٚ بوو !


